# حاكمیەت

## بەرگی دووەم



وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ

(الأنعام : ٥٥)


نوسینی : ابوعاهد (تقبل الله)

ئامادەكردنی : ابوبصیر الكوردي * دیزاین : معاوية الكوردي

# کۆمەڵێك شوبهە و گومان دەربارەی حاکمیەت

## شوبهەی یەکەم :

دەڵێت سەرپشکین لە حوکمی الله عزوجل ئەگەر بمانەوێ حوکمی پێ دەکەین و ئەگەر نەمانەوێ حوکمی پێ ناکەین واتە واجب نیە ، وە بەڵگەش قال الله تعالی :

فَإِن جَاءُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئًا وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ( المائدة : ٤٢ )

واتە/ ئەگەر هاتن بۆلات ئەوە حوکم بکە لە نێوانیان یان بیان گەڕێنەوە حوکم مەکە لە نێوانیان وە ئەگەر حوکمیش نەکەی لە نێوانیان ئەوان ناتوانن زیانت پێ گەیەنن بەڵام ئەگەر حوکمت کرد بە عەدالەت حوکم بکە لە نێوانیان ، واتە بە شەرعی الله عزوجل .

وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

ئەم ئایەتە دەربارەی یەهود دابەزیووە بە هیچ شێوەیەک شمولی مسوڵمان ناکات ، وە بەڵگەش ( جابری کوڕی عبدالله ) دەڵێت پیاوێک زینای کرد لە ئەهلی(فَدَک) ئینجا ئەهلی (فَدَک) نامەیەکیان نوسی بۆ خەڵکانێک لە یەهودی مەدینە وتیان پرسیاربکە لە محمد دەربارەی ئەو کەسەی زینای کردووە !!!

ئەگەر ئەمری پێکردن بە جەڵد لێدان ئەوە لێی وەربگرن ، وە ئەگەر امری پێکردن بە کوشتن ئەوە لێی وەرمەگرن . پرسیاریان کرد دەربارەی ئەم شتە لە پێغەمبەر علی السلام . پێی فەرموون دوو کەسم بۆ بێنن لە خۆتان کە لە هەمووتان زانا ترین ئنجا ئەوان پیاوێکی کوێریان هینا کە ناوی (ابن صوریا)بوو لەگەڵ کەسێ تر .

ئنجا پێغەمبەر علیه السلام پێی فەرموون ئێوە زاناترین کەسن لەناو خۆتاندا؟ وتیان قەومەکەمان ئەماکەیان داوەتە پاڵمان .

ئنجا پێغەمبەر صل الله علی وسلم پێیانی فەرموو سوێندتان ئەیەم بەوەی کە بەحری شەق کرد بۆ بەنی ئیسرائیل، وە هەوری وەکو سێبەر لە سەرتان وەستاند وە ڕزگاری کردن لە ئالی فیرعەون و(مَن وسلوی)دابەزاند بۆ بەنی ئیسرائیل ، ئایا چی دەبینن لە تەوراتدا دەربارەی ڕەجم ؟؟

یەکێکیان وتی بەوی تر هەرگیز سوێندی وام نەدراوە ، لە تەوراتدا دەبینین دووبارە کردنەوەی سەیر کردنی ئافرەت زینایە وە سەیرکردنی زینایە وە دەس کردنە ملی زینایە وە ماچ کردنی زینایە وە گەر چوارکەس شایەتیان دا کە بینیوویانە ئنجا تۆ ئەیهێنی هەروەکو چۆن میل دەچێتە ناو کلدانەوە ڕەجمی لەسەر واجب دەبێت، ئەوجە پێغەمبەر پێیانی فەرموو ئا ئەو مەسەلە ئاوایە ((ئنجا امری کرد بە ڕەجم کردنی کابرا یەهودیەکە ، کابراکە ڕەجم کرا ئەوجە ئەو ئایەتە دابەزی المائدە 42 )) رواه ابو داود و ابن ماجە .

ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە بەڵگەی ابو جعفر النعاس لە کتابی (ناسخ و منسوخ) وە هەروەها ئیمامی بەیهەقی لە کتابی (الست کبرا) ڕیوایەتیان کردووە لە ابن عباسەوە دەڵێت (نسخ کراوە لەم سورەتە) واتە نسخ کراوە لە سورەتی المائدە دوو ئایەتی (القلائد) وە ئەم ئایەتە ( فإن جاءوک....... فحکم بینهم بالقسط )المائدە 42 .

پێغەمبەر صلی الله علی وسلم سەربەست بوو گەر بیویستایە حوکمی دەکرد لە نێوانیان ،وە ئەگەر بیویستایە حوکمی نەدەکرد لە نێوانیان وە دەیانی گەڕاندەوە بۆ احکامی خۆیان کە تەورات بوو پاشان ئەم ئایەتە دابەزی ( وأن أحکم بها أنزل الله )

واتە/ حوکم بکە لە نێوانیان بەوەی الله عزوجل داییەزاندووە .

الله عزوجل امری کرد بە پێغەمبەر کە حوکم بکات لە نێوانیان بەوەی کە لە کتێبمان هاتووە کە قورئانی پیرۆزە . ئیمام النعاس دەڵێت ئەو کەسانەی کە وتوویانە ئایەتی 42المائدە نسخ کراوە ئیمام ( عکرمە ) و ( زوهری ) و ( عمر عبدالعزیز ) و ( الشدی ) و ( شافعی ) .

ئیمام شافعی دەڵێت لە کتاب دا بەهیچ شێوەیەک ئیمام سەرپشک نیە ئەگەر ئەهلی کتاب دادوەریان هێنا بۆلای وە دەبێت حوکم بکات لە نێوانیان لەبەر ئەم ئایەتە 29التوبە .......

واتە/ تا باج و سەرانە نەدەن بە دەستی خۆیان بە مل کەچی لە کاتێکدا ئەوان سەر شۆڕ و ڕسوان.امام النعاس دەڵێ ئەم بەڵگە هێنانەوەیەی شافیعی ڕاست ترین شێوەیە لەم بابەتە لەبەر ئەوەی مانای ئایەتەکە دەڵێت ئەوان سەر شۆڕن ئەوە دەگەیەنێت کەحوکمی مسوڵماڵمانان لەسەر ئەوان جێ بەجێ بکرێت وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە واجبە بۆ ئەحکامی خۆیان وەئەم واجب بوونە نەیان گەڕێنێتەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە.

الجحاص لە کتابی احکام القرآن دا دەڵێت إبن جریری طبری و ابن العربی دەڵێن ئایەتەکە نەسخ نەکراوە .

ابن العربی دەڵێت یەکێک لە مەرجەکانی نسخ ئەوەیە کە تاریخی ئایەتی پێشووە، ئەو ئایەتەش کە لە پاشاندا دابەزیووە دەبێت هەردووکی زانراو بێت وە ئەم مەرجە لەم دوو ئایەتە بەدی ناکرێت .

ابن الجریری طبری دەڵێت کۆکردنەوە لەنێوان هەردوو ئایەتەکە بەم شێوەیە ،حوکم بکە لە نێوانیان بەوەکە کە الله عزوجل داییەزاندووە،ئەگەر ویستت لێ بوو حوکم بکەیت لەنێوانیان ئەوەت هەڵنەبژارد کە بیان گەڕێنیتەوە .

شێخ احمد شاکر تعلیقی داوە لە کۆکردنەوەی طبری بۆ هەردوو ئایەتەکە دەڵێت :ئەم شێوازە کۆکردنەوەیە ئەوە دەگەیەنێت کە هەردوو ئایەتەکە یەک حوکمە وە لە ئایەتی دووەم تەنها دووبارە بوونەوەی حوکمی ایەتی یەکەمە بەپێی وتەکەی طبری،سیاقی هەر سێ ئایەتەکە دوو حوکمی جیاواز وەردەگرێت (٤٨-٤٩) حوکمی تازەیە کەدووجار دووبارە بۆتەوە لە دوای یەک ئەوەش دەلالەت لەوە دەکات کە تەئکید لەسەر ئەم حوکمە تازەیە دەکات .

بەڵام طبری حوکمی ئایەتی ( 48 – 49 ) وەکو حوکمی ئایەتی 42وە لە لای ئەو واتە گەر ویستی لێ بوو حوکم بکات لە نێوانیان یان ئەگەر ویستی لێ بوو حوک نەکات لە نێوانیان،وە ئەم کۆکردنەوەیە نەپێکاوە و ڕاست نیە.

شێخ احمد شاکر دەڵێت ڕوی ڕاست بۆ تێگەیشتن لەم ئایەتانە و کۆکردنەوە لە نێوانیان و بۆ تێگەیشتن لە وتەکەی ابن عباس کە باسی نسخ کردنی ئایەتەکان دەکات بەم شێوەیە :ئایەتی42سەرپشک بوو بۆ کەسانێک کە هاتن بۆلای پێغەمبەر صل الله علی وسلم بۆ ئوەی بیکەن بە حاکم لەنێوانیان بۆ کێشەی دوو زیناکەرەکە ، وە ئەمانە کەسانێک بوون لە یەهود نە ئەهلی ذیمە بوون وە نە لەوانەش بوو کە پێکهاتبوون لەگەڵ مسوڵمانان، ئەوان لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی مسوڵمانان نەبوون ، احکامی ئیسلام فەرز کرابوو لەسەریان بەڵام ئەمانە خۆیان هاتن بۆلای پێغەمبەر صل الله علی وسلم ، دەیان ویست بیکەن بەحاکم لەنێوانیان لەکاتێکدا دەیان توانی خۆیان حوکمی خۆیان بکەن لە بابەتی دوو زیناکەرەکە وە ئەو ئایەتە پاش ئایەتی42هاتووە ئەم شتەمان بۆ ڕون دەکاتەوە وەکو خۆر وە ئایەتەکەش ئەمەیە 43المائدە........،

واتە/ چۆن ئەوان تۆ دەکەنە دادوەر لەکاتێکدا کە تەوراتیان لایە حوکمی الله عزوجل ی تێدایە. ـ ئەم ئایەتە سنوری حوکمی ئایەتی پێش خۆی دیاری دەکات ئەویش ئەوەیە ئایەتی42دەربارەی کەسانێکە کە رەعیەت نین واتە خەڵکی ملکەچ بن بۆ حوکمی دەسەڵاتی پێغەمبەر پاشان ئایەتی ( 48 – 49 ) حوکمی تازەی هێنا کە امر دەکات بە پێغەمبەر حوکم بکات لەنێوان ئەوکەسانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی دان ( اهلی کتاب ) وە غەیری ئەوانیش بەوەی کە الله عزوجل دایبەزاندووە .وە شوێن هەواو ئارەزویان نەکەوێت .

وە اهلی کتابیش لە ژێر دەسەڵاتی مسوڵمانان بەهیچ شێوەیەک بۆیان نیە کە تەحاکوم بکەن بۆ احکامی خۆیان وە هیچ جیاوازیەکیشیان نیە لەگەڵ مسوڵمانان لە جێ بەجێکردنی احکامەکان لەسەریان ، ئەمانە جزیە دەدەن بە مسوڵمانان، وە هەر ئەم واتایە لە قسەکان امام شافیعی دا داخوێنرێتەوە کە لە کتابی ( الام ) دا دەڵێ :

بەهیچ شێوەیەک ئیمام سەر پشک نیە دەربارەی ئەو اهلی کتابانەی جزیە دەدەن و لەژێر دەسەڵاتی مسوڵمانان دان ئەگەر هاتن بۆلای دەربارەی حەدێک لە حدودەکان ئەوکاتە فەرز دەبێت لەسەر ئیمام کە جێ بەجێی بکات لەسەریان وەک الله عز وجل دەفەرموێت : (( حتی یُطعوا الجزیە عن یدهُم صغرون )) ٢٩التوبة .

ئەم ئایەتە واتای ئەوەیە کە دەبێت حوکمی الاسلام لەسەریان جێ بەجێ بکرێت ، وە بەهیچ شێوەیەک دروست نیە دار الأسلام شوێنی نیشتەجێ بێت بۆ ئو کەسانەی کە حوکمی ئیسلام جێ بەجێ ناکەن. امام شافعی کتاب ( الام )

احمد شاکر لە تەفسیری ابن کثیردا دەفەرموێ مەبەستی ابن عباس لە ئایەتەکە کە نسخ کراوە ئەو گشت گیریە کە لە ئایەتەکە هەیە لە هەموو شوێنێ مەبەستی نیە . _2ئەو دوو ئایەتەی تر کە باسی امر دەکات بە حوکم کردن هەندێ حاڵەتی نسخ کردوە لە ئایەتی سەر پشک بوونەکە واتە ئەو ئایەتە تایبەت بەو حاڵەیە کە یەهود هەی بوو لە سەردەمی پێغەمبەر صل الله علی وسلم ابن القیم رحمە الله دەفەرمووێ مەبەستی سەلەفی صاڵح لە نسخ (هەڵگر) مەنسوخ (هەڵگیراو)

ا-هەڵگرتنی حوکمەکە بەیەکجاری .

ب-هەڵگرتنی حوکمێکی عام یان حوکمێکی بێ مەرج یان هەڵگرتنی ظاهری حوکمەکە .

أ-کل ب- (عام-حاص) (مطلق-مقید) ظاهر .

هەڵگرتنی عام واتە تایبەتی دەکات . هەڵگرتنی بێ مەرج واتە مەرج داری دەکات وە شی دەاتەوە . نەسخ لای سەلەفی صاڵح ئەوەیە ڕونکردنەوەی دەقی پێشەوە بە دەقێکی تر کە دوای خۆی دادەبەزێت . ابن عباس ساڵی 68ی هجری کۆچی دوای کردووە 28ساڵ لە سەردەمی حوکمەکانی بەنی ئومەوی ژیاوە . هەروەها ئەم تابیعیانە((عطاء ابی رباح ، ابن طاوس ، ابی مجلز ، تەلەبەی ابن عباس بوون )) .

## شوبهەی دووەم :

( حلف الفضول ) حلف الفضول دە کە نە بە لکە بو تە حاکوم بو غە یری شە رعی الله عزوجل وە دە لین عە رە ب بیش هاتنی ئاینی ئیسلام هاوبە یمانیە کی دروست کرد پاش جە نگی فیجار بە ندە کانی هاو پە یمانیە کە ئە مانە ی خوارە وەن .

أ-شە رنە کە ن لە مانگە حە رام کراوە کان .

ب-ظولم نە کریت لە کە س لە جواردە وری کە عبە .

ج-کە س نە کوژریت لە جواردە وری کە عبە .

وە دە لێن پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی ئەگەر بانگم بکە ن بۆ ئەو هاوپەیمانیتیە پاش دینی إسلام ئە وا بوی دە چم .

وە دە لێن ئە مە دان بیدانانیکە لە لایەن پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بۆ ئەو پەیمانەی کە بەستراوە لە کاتێکا ئەم پەیمان بەستنە لە شە رعی الله عزوجل دا نەبوو سەرەرای ئەوەش پیغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرمووێت بانگم کەن بۆی دەچم .

وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

مەرجەکانی هاوپەیمانی (( حلف الفضول )) بە هیچ شێوەیەك دژایەتی ئەو پێنج ئەصلە ناکات کە الله عزوجل دایبەزاندوە ئە ویش ئە م پێنج ئەصلەیە:

أ-لفروض ب- الحدود ج- التحلیل و تحریم د- الأنصبە هـ- الموارث

بە هیچ شێوەیەك دژایەتی ئەم پێنج ئەصلەی تیانییە کە الله بۆی دابەزاندوین و تەشریعی کردوە بۆمان و کردویەتی بە یاسا بۆمان نابێت لێ ی لابدەین و دەبێت جێ بەجێیان بکەین وە هەر کەس لێ ی زیاد بکات یان لێ ی کەم بکات یان شتێکی لێبگۆرێت بە مەرجی یاسادانان و وە فەرضی بکات لەسەر خەڵك ئەوە خۆی کردوە بە ( رب ) وە ئێمەش دەڵێین

هەر یاسا و قەوانینێك یان عەقد و گرێبەستێك یان حوكمێك كە دژایەتی ئەو پێنج ئەصلە ناكات ئەوە حەرام نییە و ڕێگە پێدراوە لە شە رعی الله عزوجل دا.

وە پرسیارێك بۆ ئەهلی ئەم شوبهەیە !

ئایا حوكم كردن بە غەیری شەرعی الله عزوجل چییە ؟؟ ئەگەر دەڵێن كوفری بچوكە ئەوە پێیان دەڵێین ئایا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دان بە كفری بچوكدا دەنێت ؟ وە پێیان دەڵێن بەم قسەیەتان توشی كفربوون چونكە تومەتی كفرتان داوەتە پاڵ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم كە ئەمەش كفرێكی ئاشكرایە پە نا بە الله تعالی .

## شوبهەی سێ یەم :

دەڵێن ئەو ئایەت و حەدیثانەی كە باس لە بێ ئیمانی ئەو كەسانە دەكات حوكم دەكەن بە غەیری شەرعی الله عزوجل ئەوە مەبەستی نەمانی لابردنی ئەصلی ئیمان نییە بەڵام مەبەستی لابردن و نەمانی ئیمانی كاملە واتە ( كفر دون كفر ) وە بەڵگەشیان ئەم حەدیثانەیە :

أ-(سیباب المسلم فسوق وقتال كفر) واتە : جنێودان بە موسوڵمان فسقە و شەڕكردن لەگەڵی كفر.

ب-(لاترجعو بعدی كفار یضرب لعضكم رقاب بعض) واتە : دوای من مەبنە بێ باوەڕ هەندێكتان لە ملی هەندێكی ترتان بدات .

ج-(من غش فلیسامنا) یان (من غشنا فلیس منا) واتە : هەر كەسێك غەش بكات لە ئێمە نییە .

د-(لا یوء من احد كم حتی یحب لأ خیە مایحب لنفسە) واتە : هیچ بەندەیەك ئیمانی نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێكەی یا فەرمووی بۆ براكەی پێی خۆش نەبێت . واتە : ئیمانی تە واو نییە .

ئەم حەدیثانە و چەندەها حەدیثی تریش کە باسی بێ باوەڕی یان لە فزی کفر یان لە ئێمە نییە ی ئەو کەسە دەکەن کە لە ناو حەدیثەکاندا هاتووە ئەوە مەبەست لێ ی کفر دون کفر بە ئیجماعی ئوممەت هەروەکو زانراوە کە کوشتنی موسلمان یان غەش کردن یان کەسێك شتێکی بۆ خۆی پێ خۆش بێت بۆ برا موسولمانەکەی پێ ی خۆش نییە ئەمانە هیچیان کوفری گەورە نین کە خاوەنەکەی لە دین دەربکاتە دەرەوە .

هەروەها ئەو ئایەتانەش کە باسی بێ ئیمانی دەکات یان (کفر) دەربارەی ئەو کەسانەی تەحاکم دەکەن بۆ طاغوت یان حوکم دەکەن بە حوکمی بە شەر مەبەست لێیان (کفر دون کفر) هاوشێوەی ئەم حەدیثانەی سەرەوە .

وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

ئەصل تێگەشتنە لە دەقەکانی قورئان و حە دیث و ئیش کردنە بە ظاهیری دەقەکان بەڵام دروستە ظاهیری ئایەتێك یان حەدیثێك لابدەین بۆ مانایەکی تر ئەگەر بەڵگەیەکی ڕاستمان هەبوو وە ئەم حەدیثانە و هاوشێوەکانیان واجبە لە ظاهیرەکە یان لابدەین بۆ مانایەکی تر ئەویش (کفر دون کفر) لەبەر ئەوەی بەڵگەی ڕاستمان هەیە لە بارەیەوە.

أ-حە دیثی (سيباب مسلم فسوق وقتال كفر) وە حەدیثی (لاترجعو بعد ی کفارا یضرب لعضكم رقاب) ، ئەم دوو حەدیثە و هاوشێوەکانیان بە بەڵگەی ئەم ئایەتەی (٩) سورەتی الحجرات لە ظاهیرەکە یان لابدەین بۆ مانایەکی تر چونکە الله عزوجل دەفەرموویێت :

وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا

ئەگەر دوو دەستە ، یان دوو تاقم لە موسولمانان بوو بە شەڕیان ، ئەوە دەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە ، واتە لێرە دەی سەلمێنێت کە شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمان کفری گەورە نییە بەڵکو بە شێکە لە کوفر و لە دین دەرت ناکات .

ب-حە دیثی (من غش فليس منا) یان (من غشنا فليس منا) لە ظاهیری ئەو دوو حەدیثە لا

دەبەین بۆ مانایەکی تر بە بەڵگەی ئەوەی کە اجماعی ئوممەت بێ جیاوازی دەڵێن (غش) کفری گەورە نییە .

ج-حدیثی (لایوء من احد کم حتی یحب الأخیه مایحب لنفسه) لە ظاهیری ئەم حەدیثە لا دەین لەبەر ئەوەی اجماعی ئوممەت بێ جیاوازی دەڵێن ئەم کردەوەیە کفری گەورە نییە بەڵام ئیمانی واجب کەم دەکات .

تێبینی : بەڵام ئەو دەقانەی کە باسی بێ ئیمانی (بێ باوە ری) یان لەفزی کوفری تێدا هاتووە دەربارەی ئەو کەسانەی تەحاکم دەبەنەوە بۆ لای طاغوتەکان یان بە شەرعی الله عزوجل حوکم ناکەن یەك بەڵگەی ڕاستمان نییە کە بتوانێت بێ لە ظاهیری ئەو دەقانە لا بدەیت بۆ مانایەکی تر .

## شوبهەی چوارەم :

شوبهەیەکیان دەڵێن : دروستە بچیتە ناو حوکمەتی کافرەکان لەبەر ئەوەی پێغەمبەر یوسف (علیه السلام) چوە ناو حوکمەتی کافرەوە و حاکمەکەی کافربوو بەڵگەشیان ئەم ئایەتەی سورەتی یوسف ٧٦ الله تعالی دەفەرموویێت : مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ

واتە : بۆی نەبوو براکەی ببات لە دینی پاشاکەی ، وە دەڵێن : دینی مەلیك جیاواز بوو لە دینی یوسف (علیه السلام) لەگەڵ ئەوەش لە ناو حوکمەتەکەی بوو .

وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

أ-ابن کثیر دەڵێت یوسف (علیه السلام) پاشای میصر وەزارەتی پێدا لە وڵاتی میصر وە لە شوێن ئەو کەسە داینا کە یوسفی (علیه السلام) کڕی ئەویش مێردی ئەو ژنە بوو کە ویستی یوسف (علیه السلام) زینای لەگەڵدا بکات ، وە پاشای میصر بوو بە موسوڵمان لەسەر دەستی یوسف (علیه السلام) وە ابن کثیر ئەم قەولەی لە امامی موجاهیدە وە نقل کردوە کە پاشای میصر ناوی (الریان ابن الولید) بوو .

واته بۆمان دەركەوت كە پاشای میصر ئیمانی هێنا بە پێغەمبەر یوسف (علیە السلام) وە شوێنی كەوت وە حوكمی الله ی گەورەی جێ بە جێ دەكرد كە یوسف (علیە السلام) هێنابووی پاشان وەزارەتی دا بە یوسف (علیە السلام) .

ب-پرسیار دەكەین لە خاوەنی ئەم شوبهەیە ئایا یوسف (علیە السلام) كاتێك چوە ناو ئەو حوكمەتە كافرە وە ، وەكو ئێوە دەڵێن ئایا حوكمی دەكرد بەوەی كە الله ی گەورە دایبەزاندوە یان حوكمی دەكرد بە حوكمی ئەو طاغوتە ؟؟؟

وەڵام : ئەگەر بڵێن حوكمی دەكرد بەوەی الله ی گەورە دایبەزاندوە ئێمەش پێیان دەڵێن نابێت ئەم باسەی یوسف (علیە السلام) بكەنە بەڵگە لەسەر چوونە ناو حوكمەتێكی كافر لەبەر ئەوەی یوسف (علیە السلام) كاتێك چوە ناو ئەو حوكمەتە بە حوكمی الله سبحان وتعالی حوكمی دەكرد ، بەڵام ئێوە دەچنە ناو ئەم حوكمەتە كافرەكە بە حوكمی الله تعالی حوكم ناكەن .

ئەگەر وتیان یوسف (علیە السلام) بە حوكمی الله عزوجل حوكمی نە دەكرد ئەو كات پێیان دەڵێین بەو قسەیەتان كافربوون لەبەر ئەوەی تومەتی كوفرتان داوەتە پاڵ پێغەمبەرێكی الله تعالی كە یوسف (علیە السلام) با كوفری بچوكیش بێت وەك ئێوە دەڵێن كوفری بچوكە ، واتە لەسەر بۆ چونی ئێوە كە دەڵێن یوسف (علیە السلام) چۆتە ناو حوكمەتی مەلیكی میصر ، وە مەلیكی میصر ئیمانی نەهێنابوو وە كافربوو وە یوسف (علیە السلام) جوتە ناو حوكمەتە كوفرەكەی و پێكەوە حوكمەتیان بەڕێوە بردوە بە حوكمی بغیر ما انزل الله .

الله ی گەورە بمان پارێزێت لەو بۆ چونە كوفر و قێزەونە كە دەدرێتە پاڵ یوسف (علیە السلام) كە پێغەمبەران هیچ كات كوفری بچوكیشیان نەكردوە وە الله عزوجل پێغەمبەرانی لە هەموو تاوانێك پاك كردوتەوە و پاراستوونی .

## شوبهەی پێنجەم :

دەڵێن : دروستە حەلاڵ کردن و حەرام کردن وە بەڵگەش دەهێننەوە دەڵێن پێغەمبەری الله صلی الله علیە وسلم هەنگوینی لەسەر خۆی حەرام کرد بە بەڵگەی ئایەتی ١ سورەتی التحریم : يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ ئەی پێغەمبەر تۆ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەلاڵ کردویت .

وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

أ-هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەنگوینی لەسەر خۆی حەرام کرد و سوێندی خوارد ئیتر نەی خوات پاش ئەوەی دووان لە خێزانەکانی پێیان ووت بۆنێکی ناخۆشت لێ دێت بە هۆی خواردنی هەنگوینەوە ئایەتی ١-٢ سورەتی التحریم ئەم شتەمان زیاتر بۆ ڕوون دەکاتەوە .

لە دایکی ئیماندارانەوە عائیشە (الله لێ ی ڕازیبێت) دەفەرموێت : پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەنگوینی دەخوارد لە لای زەینەب (الله لێ ی ڕازیبێت) وە لە لای مایەوە ئینجا من و حفصە ڕێك کەوتین کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هات بۆ لای هەر کەسێکمان با پێ ی بڵێت ، ئایا مەغافیرت خواردوە کە جۆرە گیایەکی بۆن دارە من بۆنی مەغافیرت لێ دەکەم فەرمووی نەخێر بەڵام من هەنگوینم خواردوە لای زەینب ئیتر نای خۆم بە هیچ شێوەیەك وە سوێند دەخۆم لەسەر ئەو شتەش کەس ئاگادار نەکەیتەوە . ( رواە بخاری )

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئەم مەسەلەیە تایبەتە بە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم ، وە ئەوە حوکمێك نییە حوکم بکات بێ لە نێوان خەڵکی وە نەی کرد بە یاسا و فەرزی بکات لەسەر خەڵکی ، بەڵام شتێکی شەخصی بوو پاشان الله عزوجل گلەیی لێ کرد و ئایەتی بۆ دابەزاند بۆ ئەوەی سوێندەکەی بشکێنێت وە کەفارەتەکەی بدات ، ئەویش کەفارەتی سوێندەکەی دا و گەڕایەوە بۆ خواردنی هەنگوین .

وە لە شەرعی الله عزوجل هەر کەسێك سوێندێك بخوات لەسەر شتێك پاشان بۆی دەرکەوت کە خێر لەوە دا کە سوێندەکەی بخات ، ئەوە با سوێندەکەی بخات و کەفارەتەکەی بات .

ب-شەرعی الله عزوجل هەندێکی دژایەتی هەندێکی ناکات بەڵام تەواوکەری یەکترن ، ئایا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەیفەرموو بە (عدی کوری حاتەم) ئەوان حەرامیان بۆ حەڵاڵ نە دەکردن و حەڵاڵیان بۆ حەرام نە دەکردن ، ئەوانیش شوێنیان دەکەوتن فەرموو ئا ئەوە عیبادەتە (( رواه احمد و ترمزی)) ئیتر ئێوە چۆن حەق دەدەن بە خۆتان کە حەڵاڵ حەرام کەن و حەرامیش حەڵاڵ کەن ؟؟؟

## شوبهەی شەشەم :

الشبهات حول الحاكمية وەڵام دانەوەی گومانەکان دەربارەی دەسەڵات داریەتی .

کفر دون کفر (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) ( المائدة : ٤٤ ) واتە / جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا داییەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن .

ئەوەیە کە کفر دون کفر کە دراوەتە پاڵ ابن عباس کاتێک پرسیاریان لێ کرد دەربارەیی ئەم ئایەتە ((المائدة : ٤٤)) .

### وەڵام دانەوەی ئەم شبهەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت

أ-ئەم حەدیثە ضعیفە و سەنەدەکەی ڕاست نییە لەبەر ئەوەی کەسێکی تێدایە ناوی (هیشامی کوڕی حجیرە) وە ئەم پیاوە لە لایەن زانایانی اهلی حەدیثەوە ضعیفە .

ب-ابن القيم (رحمه الله)(کتاب بدائع الفوائد) دەڵێت هەر وشەیەکی کۆ کە (الـ)ی پێوە بوو مەبەست لێی گشت گیرە .قال الله تعالى ((و إذ اخذنا من النبيين ميثاقهم))

ج-امام ابن القيم (رحمه الله) دەفەرموویت : سیاقی ئایەتەکان واتای گشتیت بۆ دەسەلمێنێت ، وە لە هەمان کاتدا هەر مەعنایەکی تر لە ئایەتەکە هەبێت بۆت ڕوون دەکاتەوە .

وە سیاقی ئایەتەکان ئەوەشت بۆ یەکلا دەکاتەوە کە غەیری ئەم مانایە هەڵناگرێت ، وە هەر لە سیاقی ئەم ئایەتانە حوکمە گشتیەکان تایبەت دەکات ، وە هەر لە سیاقی ئەم ئایەتانە ئەو حوکمانە کە بێ مەرجە مەرج داری دەکات ، وە هەر لە سیاقی ئایەتەکان دەتوانی ئەوە بخوێنیەوە کە یەك مانا هەڵدەگرێ یان زیاتر . وە ئەمانەی کە باس کران گەورەترین بەڵگەن بۆ ئەوەی بزانیت الله سبحان وتعالی چی دەوێت لەو ئایەتانە وە هەر کەسێک ئەمانە ئیهمال بکات ئەوە هەڵەیکردووە لە لێکدانەوەی ئایەتەکان ، وە بەڵگە بۆ ئەمە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە الله سبحان وتعالی دەفەرموێ : ((ذق إنک انت العزيز الكريم)) واتە: بچێژە تۆ کەسێکی بە عیزەت و ڕێزداری .

ئایا چی دەبینی لە سیاقی ئەم ئایەتە ؟ ئایا ئەوەی لێ ناخوێنیتەوە کە کەسێکی بە عیزەت و ڕێزداری ؟ ڕسوا و زەلیلە بەڵێ دەتوانی وا بخوێنیەوە ، بەڵێ ئەمە سیاقی ئەم ئایەتانەیە با سەیری بکەین بزانین چی لێ دەخوێنرێتەوە :(٤١-٤٢-٤٣-٤٤) : المائدة ( يأَيُّها الرسول لا يحزنک الذين يُسارِعون فی الكفر ................. فأُلئک هم الكفرون )

٤١_٤٢ ابن کثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموویت ئەم ئایەتانە دابەزیون دەربارەی ئەو کەسانەی کە پەلە دەکەن لە کفر وە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی اللە سبحان وتعالی وە پێغەمبەرەکەی صل الله علی وسلم ، وە لە هەمان کاتدا بۆ چوون و هەواو ئارەزووی خۆیان پێش شەرعی اللە عز وجل دەخەن لەوانەی کە وتیان ئیمانمان هێناوە بەڵام بە دڵ ئیمانیان نەهێناوە وە ئەمانەش منافیقەکانن وە لەوانی تریش کە یەهودن دوژمنانی ئیسلامن و دوژمنانی مسوڵمانانن هەر وەکو الله عز وجل دەفەرموویت : قال الله تعالی ((يعرفون اليكم من بعد مواضعه الحرم))

دەڵێن تەئویلی دەکەن بە شێوەیەک کە مانای ئایەتەکە نیە وە دەیگۆڕن پاش ئەوەی تێگەیشتن لێی وە دەشزانن تغیر الکثیر وە چەند حەدیسێکی تریش هاتووە دەربارەی دابەزینی ئەم ئایەتانە وە لە وانەش حەدیسەکەی ((براء بن عازب)) کە ئیمام احمد و موسلیم ڕیوایەتیانکردووە .

وە هەروەها ایمام احمد بن کثیر دەفەرموێت لە کاتێکدا دانیان پێدا ناوە لە هەمان کاتیشدا کردەوەکەیان پێچەوانەی ئەو دان پێدانانەیە ، ئەوکات دەرکەوت ئینکاریان کردووە ، وە بە درۆ خستنەوەی ئەو بیر و باوەڕەیە کە هەیان بوو کە دەیان زانی کە ڕاستە لەو کتابە الله عز وجل داییەزاندووە بۆیان .

ئەم ئایەتە(( ومن لم یحکم بما انزل الله فالئک هم الکافرون )) المائدة : ٤٤ دەربارەی ئەم ئایەتە ((براء بن عازب و حذیفە بن یمان و ابن عباس حصن بصری و غەیری ئەمانیش دەڵێن ئەم ئایەتە دەربارەی یەهود دابەزی و حسن بشیر دەڵێ لەسەر ئێمە ئەم ئایەتە واجبە ، وە لەلای زانایانی تەفسی یاسایەک هەیە کە دەڵێت ((العبره بعموم اللفظ لا بخصوص السبب)) .

واتە/ سود وەرگرتن لە ئایەتەکان بە دەربڕینە گشتیەکان نەک بە هۆکاری دابەزینی تایبەتی ئایەتەکان .

وآخر و دعوانا أن الحمدلله رب العالمين

وصل الله على محمد وعلى ال محمد